تەوحیدی الأسماء و الصفات سێ بەشە :

١ - ناوەکانی پەروەردگار .

٢ - صیفەتەکانی پەروەردگار .

٣ - هەواڵەکان دەربارەی پەروەردگار .

بابی هەواڵەکان فراوانترە لە بابی ناو و صیفەتەکان، واتە ئەکرێت دەربارەی الله تعالى هەندێک هەواڵ بوترێت، بەڵام هەواڵەکە وەکو ناو یان سیفەت بۆ بەکارنەهێنرێت .

الله تعالى هەندێک کاری بەکارهێناوە بۆ نەفسی خۆی لە کیتابەکەی وەک : | صُنْعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ أَتْقَنَ كُلَّ شَىْءٍ | (النمل : ٨٨)

| صِبْغَةَ ٱللَّهِ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ صِبْغَةً | (البقرة : ١٣٨)

| إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ | (هود : ١٠٧)

**ابن قيم** لە **(بدائع الفوائد : ١/٢٨٤)** ئەڵێ :

ئەوەی ئەچێتە بابی هەواڵەکانەوە فراوانترە لەوەی ئەچێتە بابی ناو و صیفەتەکانی، وەک (شت) و (هەبوو) و (ڕاوەستاو بە نەفسی خۆیەوە)

ئەمە هەواڵدانە دەربارەی، وە ناچێتە ناو ناوە جوان و صیفەتە بەرزەکانیەوە .

وە لە **(المدارج : ٣/٤١٥)** ئەڵێ :

وە (الواجد) ئەچێتە ناو ناوەکانی پەروەردگار بەبێ (الموجد) چونکە (الموجد) صیفەتێکی کرداریە، وە (الوجود) - واتە بوون - ئەبەخشێت، وەک (المحيي) کە ژیان ئەبەخشێت، وە ئەم کردارە بە ڕەهایی نەهاتووە لە کردارەکانی اللە لە کیتاب و سوننەت، نەزانراوە بە ڕەهایی بوترێ (اللە ئەوە و ئەوەی کردە بوون) بەڵکو ئەوەی هاتووە : (دروستی کرد، شێوەی کێشا، دروستکراوێتی پێ بەخشی)، بۆ کردارەکەی ناوێک نەهاتووە لە ناوە جوانەکانی، چونکە کردار فراوانترە لە ناو .

وە بۆ ئەمەیە کە اللە هەنێک کرداری هێناوە لەسەر نەفسی خۆی کە ناوی نەهاتووە لە ناوەکانی بکەرەکەی، وەک (أراد، شاء، أحدث) وە ناو نەهاتووە بە (المريد، الشائي، المحدث) وەک چۆن ناو نەهاتووە بە (الصانع، الفاعل، المتقن) و جگە ئەمانەش .

هەڵەی کردووە قێزەونترین هەڵە ئەو کەسەی لە هەموو کردارێک ناوێک دەربهێنێ و بیکات بە ناوەکانی پەروەردگار وەک : (الماكر، المخادع، الفاتن، الكائد) .

**: واتە ئەم کردارانە (أراد، شاء، أحدث) وە هاوشێوەکانی تەنها وەکو هەواڵدانێک دەربارەی الله تعالی بەکارئەهێنرێت، نەوەک لەو کردارانە ناو دروست بکرێت .**

چەند نمونەیەک لە هەواڵەکان دەربارەی الله تعالی لەسەر مەنهەجی ئەهلی سوننە :

١ - هەواڵدان بەوەی الله تعالی (شخص) ە .

سوننەت بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لەفظی (شخص) بەکاربهێنرێت بۆ الله تعالی .

ابن أبي عاصم (٢٨٦ ھ) لە (كتاب السنة : ٣٦٤/٢) بەڵگەی هێناوەتەوە بە فەرموودەی سعد بن عبادة کە تێیدا رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (هیچ شخص ێک لە الله بەغیرەتر نیە، وە هیچ شخص ێک وەک الله عوزری پێ خۆش نیە) .

عبدالله القواريري رحمه الله (٢٣٥ ھ) ئەڵێ : هیچ فەرموودەیەک توند نیە لەسەر جەهمیەکان بەشێوەی ئەمە : (هیچ شخص ێک وەک الله ستایشکردنی پێ خۆش نیە) .

ئیمامی البخاري لە سەحیحەکەیدا باب ێکی داناوە بەناوی :

باب قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ : (لاَ شَخْصَ أَغْيَرُ مِنَ اللَّهِ) .

واتە (دەروازەی وتەی پێغەمبەر ﷺ : (هیچ کەسێک بەغیرە تر نییە لە الله) .

لەژێر ئەم باب ـەدا ئیمامی البخاري فەرموودەیەک ئەهێنێتەوە کە رسول الله ﷺ تێیدا ئەفەرموێت : (لاَ شَخْصَ أَغْيَرُ مِنَ اللَّهِ)، واتە وشەی (شَخْص : کەس) بۆ الله تعالی بەکارئەهێنێت .

وەکو ئەبینن رسول الله ﷺ الله تعالی ی بە شخص وەسف کردووە، کە بەرامبەرەکەی لە زمانی کوردی بریتیە لە (کەس)، بەڵام جەهمیەکان ئەمە لە رسول الله ﷺ قبووڵ ناکەن و ڕەتی ئەکەنەوە، وەکو هەمیشە پیشانی ئەدەن کە شوێنکەوتەی الله تعالی و رسول ـەکەی ﷺ نین، هەموو کەسێک خاوەنی سیفەتە، وە جەهمیەکانیش سیفتەکانی الله تعالی ڕەت ئەکەنەوە، هەربۆیە لەمەشدا دژی رسول الله ﷺ ئەوەستنەوە .

إبن حجر العسقلاني الأشعري الجهمي لە خیانەتە گەورەکەی بۆ سەحیحی ئیمامی بوخاری لە **(٤٠٠/١٣)** لە ڕوونکردنەوەی ئەم فەرموودەیەدا وتەی ئیمامەکانی إبن بطال و الخطابي و إبن فورک ی ئەشعەری جەهمی ئەهێنێتەوە بۆ نەفیکردنی سیفەتی (شَخْص) .

- إبن بطال ئەڵێت : (ئوممەت ئیجماعیان هەیە لەسەر ئەوەی کە الله تعالی ناکرێت بە شَخْص وەسف بکرێت !)

تەماشای ئەو بێحەیایی و بێشەرمیەی بکە ئەم ئەشعەریە جەهمیە هەیەتی ! ئەوەتا رسول الله ﷺ لەم فەرموودە سەحیحەدا الله تعالی بە شَخْص وەسف ئەکات، وە ئیمامی البخاري یش لە کتاب التوحید ی

سەحیحەکەی بەڵگەی بە فەرموودەکە هێناوەتەوە بۆ ئیثباتکردنی سیفەتی شَخْص، وە بگرە باب یَکیشی بەوناوەوە ناو ناوە، ئیتر مەگەر جەهمیەکان ئیجماعیان هەبێت لەسەر ئەوەی کە الله تعالى نابێت بە شَخْص وەسف بکرێت .

- وە الخطابي ئەڵێت : (بەکارهێنانی لەفزی شَخْص جائیز نییە لە سیفاتەکانی الله تعالى) .

تەماشای زەندیقیەتی ئەم ئەشعەریە جەهمیە بکە، ئایا رسول الله ﷺ نەیزانی کە نابێت لەفزی شَخْص بۆ الله تعالى بەکاربهێنرێت؟!؟ تەماشا بکە رحمک الله زۆر ڕوون و ئاشکرایە کە ئەم ئەشعەریە کافرە زەندیقە ڕەددی رسول الله ﷺ ئەداتەوە .

- وە إبن فورک لە باسی لەفزی شَخْص ئەڵێت : (ئیجماع هەیە لەسەر ڕێگری کردن لە بەکارهێنانی) .

لەدوای ئەم هەموو ڕەددانەوەی رسول الله ﷺ لەلایەن ئیمامە ئەشعەریە جەهمیەکانی إبن حجر العسقلاني الأشعري الجهمي و وە بەڵگەهێنانەوەی إبن حجر بە قسەکانی ئەوان بۆ ڕەددانەوەی رسول الله ﷺ، ئیتر چی تر ببینیت ئەگەیت بەو قەناعەتەی کە هەر چواریان یەک لە یەک کافرتر و زەندیقترن؟!

**٢** - هەواڵدان بەوەی الله تعالی (شيء) ـە .

كیتاب و سوننەت بەڵگەن لەسەر بەكارهێنانی لەفظی (شيء) بۆ الله تعالی .

البخاري لە صحیح ـەكەی كتاب التوحید بابێكی داناوە لەسەر ئایەتی | **قُلۡ أَيُّ شَيۡءٍ أَكۡبَرُ شَهَٰدَةٗۖ قُلِ ٱللَّهُۖ** | (**الأنعام : ١٩**) و ئەڵێ :

الله نەفسی خۆی ناونا شت، وە پێغەمبەر قورئانی ناوبرد بە شت، وە ئەوەش صیفەتێكە لە صیفەتەكانی الله، دواتر بە سەنەدی خۆی فەرموودەی سهل بن سعد ئەهێنێت : رسول الله بە پیاوێكی فەرموو : (ئایا شتێك لە قورئانت پێیە؟)

فەرمووی: بەڵێ، سورەتی ئەوە و سورەتی ئەوە، بۆ ئەو سورەتانەی ناوی هێنا.

**٣** - هەواڵدان بەوەی الله تعالی (بە زاتی خۆی) لەسەر عەرشە

پێشەوایانی ئەهلی سوننە قسەیان بەمە كردووە كاتێك موعەطیلەكان وتیان بەرزبۆتەوە بۆ سەر عەرش لەڕووی مەجازەوە نەك بە حەقیقی.

ابن قیم ئەڵێ : كاتێك جەهمیەكان وتیان استواء مەجازە، ئەهلی سوننە وتیان (بە زاتی خۆی) بەرزبووەتەوە بۆ سەر عەرش .

واتە وای لێهات جەهمیەكانیش لە ترسی ئەهلی سوننە كوفری خۆیان ئەشاردەوە و ئەیانوت الله لەسەر عەرشە، بەڵام هەر لە ناخدا باوەڕیان بەوە نەبوو كە الله لەسەر عەرش بێت، هەربۆیە ئەیانوت الله لەسەر عەرشە بە عیلمەكەی! یان بە قودرەتی! یاخود ئەیانوت لەسەر عەرشە بەڵام ئەوە مەجازە، واتە قسەكەیان مانایەكی تری هەڵگرتبوو، هەربۆیە ئەهلی سوننە وتیان الله تعالی لەسەر عەرشە بە ذاتی خۆی بۆ ئەوەی عەقیدەی حەقیقی ئەهلی سوننە و جەماعە كە شوێنكەوتەی رسول الله ن ﷺ دەربكەوێت، لەگەڵ عەقیدەی حەقیقی جەهمیە جەهەنەممیەكان كە شوێنكەوتەی جەهلی كەلامن .

٤ - هەواڵدان بەوەی اللّه تعالی (سنوری هەیە و جیایە لە دروستکراوەکانی)

ئیمام عبدالله بن المبارک (١٨١ هـ) ئەڵێ :

پەروەردگارمان ئەناسین بەوەی لەسەروو حەوت ئاسمانەکەوەیە، لەسەر عەرشە، (جیایە لە دروستکراوەکانی بە سنورێک)، وە ئەوە ناڵێین کە جەهمیەکان ئەیڵێن، لێرەدایە، بەدەستی ئاماژەی کرد بۆ زەوی .

(السنة لعبدالله : ٢٠٢)، (نقض الدارمي : ٣٣)

ابن تیمیة لە (بیان تلبیس الجهمیة : ٤٩١/٣) ئەڵێ :

جێگیر بووە لە پێشەوایانی سەلەفەوە کە وتوویانە (اللّه سنوری هەیە) وە ئەوەش کەس نایزانێت جگە خۆی، وە (جیایە لە دروستکراوەکانی) لەمەشدا ئەهلی سوننە دانراویان هەیە .

البربهاري رحمه الله لە (شرح السنة : ٨٦) ئەڵێ :

(بزانە خەڵک ئەگەر بوەستن لەلای فەرمانە داهێنراوەکان، وە ڕێگە بە هیچ شتێکی نەدەن، وە قسانێک لەدایک نەئەبوون کە هیچ نەهاتبێت لەسەری لە ئەثەری رسول اللّه ﷺ، وە لە هاوەڵەکانی، بیدعە نەئەبوو) .

لە کۆتاییدا پێویستە کەسی سوننی ڕۆنەچێت لەم بابەتەدا و شوێنکەوتەی زانایانی پێش خۆی بێت لە زانایانی ئەهلی سوننە و ئەثەر،

ئەوە بڵێ کە ئەوان وتوویانە، وە بێدەنگ بێت لەوەی بێدەنگ بوون لێی، وە ڕێگری بکات لە ڕۆچوون لە قسەکردن تێیدا .

والحمدلله رب العالمين